


# Do Not Care

Auther
Negar Nadir

kurdistan 2015

ناوی کتێب: گێ مەدەیە

نووسەر: نیگار نادر

پیتچن و دەرهێنانی هونەری: سەید ئارام

بەرگ: سەید ئارام

فۆتۆی بەرگ: سەفین ئەحمەد

تیراژ:

ژمارەی سپاردن (    ) ساڵی ٢٠١٥

هەولێر: ٢٠١٥

## گێ مەدەیە ..

گێ مەدەیە بەرهەمێکی ڕەخنەیی و تـەنزئامێزە، لـەو بەرهەمـەدا هەوڵدراوە بە وشە پەلاماری ئەو نەریتە ناشیرینانە بدرێ کە مۆدێرنـە کردوونی بە ئەخلاقێکی باو، مۆدێرنە گورزی گـەورەی لـەزمان داوەو کۆمەڵگایەکی نمایشی دروستکردوە، پێموایە دەبێت لـەو سـەردەمەدا هەڵوەستەیەك هەبێت لەبەرامبەر ئەو هەموو پەستانەی ژیانی مۆدێرن بەهەموو شێوازەکانیەوە خستویەتە سەر مرۆڤـ، لەسـەر پۆشـتەبوون، کۆك بوون، گونجاوبوون، سازان، سازشکردن، بەناوبانگ بوون، پاڵەوان بوون، خۆبەدەستەوەدانو بۆ ئەوەی مرۆڤ فەرمانبەرێکی گوێڕایەڵ بێت

بۆ هەموو بنەما ڕواڵەتیەکانی ژیان، کە مۆدێرنە لەژێر ناوی پێشکەوتن و سیستەم بەیەك ستایل بەسەر هەمووانی دا دەسەپێنێت.

ئەو بەرهەمە هەوڵێکە بۆ ئاماژەدان بەو گوفتارو هەڵسووکەوتە نالەبارانەی خەریکە دەبن بە دیاردەیەك لەناو کۆمەڵگەو لەڕووی کولتووریەوە ئەگەر وردیش بن، بەڵام مەترسیدارن و بەرە بەرە نەوەیەك لەسەریان ڕادێت و پێیان پەروەردە دەبێت، بەڵام لەبەر ئەو قەرەباڵغییەی ناوو نازناوەکانی مۆدێرنە، کەس گوێ ناداتە ئەو پرسە، کەس ناپرسێ ئایا ئەو هەڵسوکەوت و گوفتارانە دەبن بە بەشێك لە ئەخلاقی نەوەی ئایندە، ڕۆشنبیرانیش خۆیان لەو تێکچوونو هەلاهەلا بوونە کولتووریە بەخاوەن ناکەن.

(گوێ مەدەیە) ئیدیۆمێکی کوردییە، بەڵام من لێرەدا زاراوە هەولێرییەکەیم بەکارهێناوە کە دەڵێین (گێ مەدەیە) بەمانای ئەوە

دێت کە هەر شتێك ڕوویدا گوێی لێمەگرە یان بەگرنگی وەرمەگرە، چونکە بۆخۆی چاك دەبێت یان هیچ گرنگ نییە ئەنجامی چ دەبێت.

لێرەدا هەوڵمداوە چەند ئیدیۆمێکی تر زیندوو بکەمەوەو بەهەندێك دەستکاریەوەو بەشێوەیەکی ڕەخنەئامێزو تەنزئامێز تێکەڵەیەکی لێ دروست بکەم.

ئەو بەرهەمە جیاواز لەوەی هەوڵێکە بۆ دەستنیشانکردنی دیاردەو هەڵسوکەوتە نامۆیەکان، بە ئاراستەیەکی تر هەوڵێکە بۆ زۆر بە گرنگ وەرنەگرتنی ئەو ژیانە لە قاڵبدراوەی مۆدێرنە، کە بەسەر کۆمەڵگەیدا سەپاندوەو چەندین بارگرانی دەروونی بۆ مرۆڤ دروستکردوە، لەبەرئەوە من هەوڵمداوە زیاتر بەشێوەیەك ڕستەکان دابڕێژم کە پێکەنین هێنەربن یان پلارێك بن بەپێچەوانەوە، تا خۆشتر

باری سەر دڵی هەمووان سووکتر بکەنو ببنە هۆی ئارامی دەروونــی و بە سەخت وەرنەگرتنی ژیان.

لەبەرئەوە خوێنەرانی خۆشەویستم هیوادارم بە پێشکەشکردنی ئەو بەرهەمە بتوانم خزمەتێك بــە بــیرو دڵــی ئێــوە بکــەم و لەئایندەشــدا ستایلێکی نوێ لەنووسین و کتێبی دڵگیرتر بۆ ئێوە دیاری بکەم.

**نیگار نادر**

گێ مەدەیە

خۆ ژیان بە شەرت نییە.

**گێ مەدەیە**

**خۆ بەتەما نیت، بچیە سەر مانگ.**

**گێ مەدەیە**

**وەڵامی سندانێ، قوزەڵقورتە.**

گێ مەدەیە

دڵت چی خواست، ئەوی بخۆ.

**گێ مەدەیە**

**بڵێ (بەڵێ) لەبۆ هەموو ئەوانەی دەتگوت (نەخێر).**

**گێ مەدەیە**

**هەرچی مۆدەیە فشەیە، چ کراسێکت لێ جوانە، ئەوی بپۆشە.**

**گێ مەدەیە**

**خۆ مرۆڤـ بوون، بە شەرت نییە.**

**گێ مەدەیە**

**تا لە ژیان دا بمێنی هەموو نوێژێك دەگێڕدرێتەوە.**

**گێ مەدەیە**

**واز لە هەموو ڕاهێنانە وەرزشییەکانت بێنە، چما چ دەبێ!**

**گێ مەدەیە**

**هیچ تیۆرێك، بە گرنگ وەرمەگرە، پێناسەی هەموو ژیان، لــە گیرفانی خۆتدایە.**

**گێ مەدەیە**

**هەمیشە جغارە بە جغارەی داگیرسێنە.**

گێ مەدەیە

بە دڵی خۆت، پێ لەسەر بەنزین دابگرە.

**گێ مەدەیە**

**هەر شتێکت لێ چەقی، بەجێی بهێڵە.**

**گێ مەدەیە**

**تا نەدۆڕێی، ناگۆڕێی.**

**گێ مەدەیە**

**دەست بۆ تۆقە درێژکە، لەگەڵ هەموو کەسێك، ئەگەر پێشت خۆش نەبێ.**

**گێ مەدەیە**

**چونکە بە هەموو تۆپێك، گۆڵ ناکرێ.**

گێ مەدەیە

خۆ عەقڵ بە شەرت نییە.

**گێ مەدەیە**

**ئەگەر کوندەپەپۆشت لەسەر هەڵنیشێ، هەر دەتکەن بە وەزیر.**

**گێ مەدەیە**

**یەك دەرزەن قفڵی دی بکڕە.**

**گێ مەدەیە**

**هەمیشە دڵ بە دروشمەکان خۆش بکە.**

**گێ مەدەیە**

**ئەگەر دڵت شکا، دووسێ حەبی دژە خەمۆکی قووتدە.**

**گێ مەدەیە**

**بنووسە خۆشم دەوێو (send group)ی بکە.**

**گێ مەدەیە**

**لە هەموو جێگایەك، پینەدۆز دەستدەکەوێت.**

گێ مەدەیە

**چۆن ئەقڵت گرتی، وا پێناسەی هەموو شتێك بكە.**

**گێ مەدەیە**

**ژیان بە تۆ چۆڵ نابێت.**

**گێ مەدەیە**

**خۆ بانگی محەمەدیش، بەئاشکرا خۆشە.**

**گێ مەدەیە**

**تا هێزت تێدایە، هاوارکە.**

**گێ مەدەیە**

**هەتا مردنیش دوو قسەیە، یا دەمری یا نا!**

**گیٚ مەدەیە**

**خۆ مەرج نیە کردارو گوفتارت یەك بن..**

**گێ مەدەیە**

**ئەوەی لێی بترسی، حەتمەن بەسەرت دێت.**

**گێ مەدەیە**

**دەرمانی ڕێگا، ڕۆیشتنە.**

**گێ مەدەیە**

**قەت سەعات، لە دەست مەکە، خۆ کات هەر دەگوزەرێ.**

**گێ مەدەیە**

**ئەگەر پلانەکەت جێبەجێ نەکرا، پیلان داڕێژە.**

**گێ مەدەیە**

**قەڵەوی‌و لاوازی کێشە، بەڵام کێشە نییە، چۆن دڵخۆشی وابژی.**

**گێ مەدەیە**

**هەر بیرۆکەیەکت بە خەیاڵدا هات، خێرا تاقی بکەوە.**

**گێ مەدەیە**

**هەرگیز شەرت نییە، هەمیشە هەموو مووەکانی پرچت شانەکەی.**

**گێ مەدەیە**

**عەتر چەندە گران بێت، هەر بیکڕە.**

گێ مەدەیە

پەیوەندی بە کەسێکەوە بکە، کە دەڵێن یاساغە پەیوەندی پێوە بکەی.

**گێ مەدەیە**

**دەستنوێژ هەڵگرەو بە دڵ نوێژێك بكە، ئەگەر ساڵی جارێكیش بێت.**

**گێ مەدەیە**

**پاشکۆبوون بۆتە کولتوور، ئەگەر پاشکۆی سیاسی نەبیت،**

**پێویستە پاشکۆی زانستی یا هزری بیت.**

**گێ مەدەیە**

**هەر سێوێکت وەچنگ هات قەمپاری لێدە!**

**سێو هەر سێوە.**

**گێ مەدەیە**

**خۆشەویستی، قەت دەمو جەمی بۆ نییە.**

**گێ مەدەیە**

**مووچەی ئەو مانگەت، هەمووی سەرف کە!**

**گێ مەدەیە**

**لە هەر شتێك بێزار بووی، بچۆ سەیری یاری تۆپی پێ بکە.**

**گێ مەدەیە**

**لەو ژیانەدا چاوشارکێ بکە، لەگەڵ هەر شتێك کە بەردەست بوو.**

**گێ مەدەیە**

**ئەگەر زۆر بێزاربووی، بوتڵێك پیپسی بە دەمتەوە بنێ، تـا دوا قەترەی بخۆرەوە.**

**گێ مەدەیە**

**ئەگەر لەسەر کار دەربکرێی، خۆ لەژیان دەرناکرێی.**

**گێ مەدەیە**

**ئەگەر بۆینباغ لە ملی خۆت گرێ نەدەیت، نە بە سیاسی نە بە بازرگان نە بە پرۆفیسۆر نە بە ڕۆشنبیر دەناسرێیت.**

**گێ مەدەیە**

**لێرەوە بەدوا ، مۆدەی ژیانی قەترێنراوە!**

گێ مەدەیە

خۆ لە هەموو هەوران نابارێ.

**گێ مەدەیە**

**هەموو دەمێ، دوو سێ حەبی پاراسیتامۆڵی زیادە هەڵگرە.**

**گێ مەدەیە**

**پەڕەشوتێك بكڕەو، تاقی بكەوە.**

**گێ مەدەیە**

**ئەگەر ماناکانی ژیانت لەبیرچوونەوە، تێر پێبکەنە.**

**گێ مەدەیە**

**بچۆ ئارایشتگایەكو بڵێ بەڵێ بە دڵی خۆتان، سەرو سەكوتم هەڵپاچن!**

**گێ مەدەیە**

**بچۆ هوتێلێکی پێنج ئەستێرە و تەخت لێی بنوو.**

**گێ مەدەیە**

**منداڵانە تێرتێر بگرییێ.**

**گێ مەدەیە**

**ژیان بە دڵی خۆت لێخوڕە.**

**گێ مەدەیە**

**لە گۆترە هەموو شتێك هەڵگرە.**

گێ مەدەیە

خۆت بخە (بۆش)و مەترسە چی ڕوودەدات.

گێ مەدەیە

دان بە هەموو درۆیەکانت دابنێ.

گێ مەدەیە

شەق لە هەموو خۆزگەکانت هەڵدە!

**گێ مەدەیە**

**بە هەموو شتێك بڵێ زۆر زۆر ئاسانە.**

**گێ مەدەیە**

**هەر شتێك لە بەرژەوەندیت بوو، لەسەری بنووسە (نەتەوەیی).**

**گێ مەدەیە**

**بە هەموو جیاوازییەکانتەوە جوانتر دەبیت.**

**گێ مەدەیە**

**هەر ڕوخسارت جوان بێ، دەنگ دەهێنی بۆ پەرلەمان.**

**گێ مەدەیە**

**بڵێ بە تەمای خودای.**

**گێ مەدەیە**

**چۆن چاوت دەخوازێ، وا ژیان بگوزەرێنە.**

**گێ مەدەیە**

**ئەگەر (حەج) بە قسمەت نەبوو، بڕۆ عەمرەی.**

**گێ مەدەیە**

**لە کوردستان هەموو شت حیکایەتی (مێش)ێیە.**

**گێ مەدەیە**

**هەرچی نەخشە هەیە، بیاندڕێنە!**

**گێ مەدەیە**

**بڕۆ جوانكاری بۆ هەموو شتێك بكە!**

گێ مەدەیە

هەر دەگەیتە جێگایەك.

**گێ مەدەیە**

**لەو ڕۆژگارە، لەپڕێك دەبیە کوڕێك.**

**گێ مەدەیە**

**چیت بەسەر زمان داهات، ئەوی بڵێ.**

**گێ مەدەیە**

**ئەوەی لە عالەمێ عیبرەتە، ئەتۆ بیکە بە عادەت.**

**گیٚ مەدەیە**

**هەموو بۆشاییەك پڕبکەوە.**

گێ مەدەیە

لەو ژیانەدا، هەر دەبێت چەند جار ببەزی.

گێ مەدەیە

شوکر بۆ خودا، هێشتا خۆ پێکەنین بە خۆڕاییە!

**گێ مەدەیە**

**هەرچی بە قسمەتت بوو، خێری تێدایە.**

**گێ مەدەیە**

**هەرگیز کای کۆن، بەبا مەکە.**

**گێ مەدەیە**

**ئەگەر ژیان پەنچەر نەبێت، بۆ خۆت هەر چارەت هەیە.**

**گێ مەدەیە**

**خەڵك چۆن ڕۆیی، ئەتۆش بەدوایانکەوە.**

**گێ مەدەیە**

**ئەگەر باڵیش بگری، تەمەن هەر تێدەپەڕی.**

**گێ مەدەیە**

**دڵت بە چییەوە گیرسا، ڕاست لەوێ ڕاوەستە.**

**گێ مەدەیە**

**ئەگەر (بۆش)یش بی، هەر ناوت مرۆڤە.**

گێ مەدەیە

لەو سەردەمەدا، ئاوەژووبوونەوە نابێتە خەوش.

**گێ مەدەیە**

**ئەگەر گێڕ نەگۆڕی، هەرگیز بەناوبانگ نابیت!**

**گێ مەدەیە**

**زبڵی سیاسی، هەر زبڵی مەعریفی دروست دەکات.**

**گێ مەدەیە**

**لە چەند ئاوانیش بدەی، کەس نازانێ.**

**گێ مەدەیە**

**چیدی شانە لەسەری خۆتدا مەشکێنە.**

گێ مەدەیە

بێدەنگ بە، هیچ بە ڕووی خۆتەوە مەگرە.

**گێ مەدەیە**

**بە پایان بگرەو بێ پا هی خۆتن.**

**گێ مەدەیە**

**ئەگەر چوویتە شاری بێ دڵان، دڵی خۆت دەربێنە!**

**گێ مەدەیە**

**لەو دنیایە، هەر گا دەیکا و کەر دەیخوا!**

**گێ مەدەیە**

**هەر ڕێگایەك، ڕێگایەکی دی لێ دەبێتەوە.**

**گێ مەدەیە**

**کە تووڕەبووی، تەڕو وشك پێکەوە بسووتێنە.**

**گێ مەدەیە**

**چۆن بانگیان کردی، وا وەڵام بدەوە.**

گیٚ مەدەیە

**ئەگەر (بەگ)یش دابنیٚی، ژیان هەر بەرەو پیٚشەوە دەڕوا.**

**گێ مەدەیە**

**هەر دڵ نا، هەموو شتەك ڕەنگە بشكێت.**

**گێ مەدەیە**

**ئەگەر بە پێچەوانەش بڕۆی، هەر لە تەمەنت دەڕوا.**

**گێ مەدەیە**

**هەر ڕاستی شایانی باس نییە!**

**گێ مەدەیە**

**شەرت نیە چیت چاند، هەر هەمان شت بدوریتەوە.**

**گێ مەدەیە**

**هەر ئەستێرەی کلکدار لە ئاسمان نییە، مرۆڤی کلکداریش لەوێیە.**

**گێ مەدەیە**

**هەمیشە یەك دەرزەن، سیکۆتینی زیادە، لەگەڵ خۆت هەڵگرە.**

گیٚ مەدەیە

هەر ژیان چەقی، قاقایەك لیٚ بدە.

**گێ مەدەیە**

**بە گوڵی سروشتیو بە گوڵی نایلۆن، هەر دەڵێن گوڵ.**

**گێ مەدەیە**

**هەر ئەستێرەیەك بكەیتە هی خۆت، هەر ئەستێرەیە.**

**گێ مەدەیە**

**ئەورۆ گرنگ ئەوەیە، ترومبێلەکەت چەند کیلۆمەتر ڕۆیشتووە، بۆ خۆت نا.**

**گێ مەدەیە**

**حیزبگۆڕکێ، بۆتە هونەر.**

**گێ مەدەیە**

**حەزت لە هەر چ بوو، بڕۆ ناسنامەکەی دەربهێنە.**

**گێ مەدەیە**

**ئەگەر سەد پینەشت پێوەبێت، حیزب کارو ناوت بۆ دەدۆزێتەوە.**

گێ مەدەیە

دڵ، ئەگەر بشکێ، کەس نایبینێ.

**گێ مەدەیە**

**خۆت لەگەڵ هەموو کەسو هەموو شتێك بگونجێنە، ئەگەر ژیانیش نەگونجێ.**

**گێ مەدەیە**

**بازاڕ پڕە لە بۆنو تامو ڕەنگی دەستکرد.**

**گێ مەدەیە**

**بەرەو پاش گەڕانەوەش هونەرە.**

**گێ مەدەیە**

**گوڵی سروشتی، دەبێت مرۆڤی سروشتی پەروەردەی بکا.**

**گێ مەدەیە**

**شەڕو نیوەشەڕ هەر یەکە.**

**گێ مەدەیە**

**ئەگەر مانگیش بەدەرنەکەوێ، گڵۆپی لە شێوەی مانگ داگیرسێنە.**

**گێ مەدەیە**

**زۆر بدەو کەم بستێنە، خۆ هەر حسێبە.**

**گیٚ مەدەیە**

**هەر شوتی بە شەرتە، ژن بوون نا.**

**گێ مەدەیە**

**گۆم تا قووڵتر بێت، مەلەی خۆشترە.**

**گێ مەدەیە**

**هەر تۆیەك لەبەردەستت بوو، ئەوە بچێنە.**

**گێ مەدەیە**

**ئەگەر ددانیشت نەبێت، ژیان هەر ژیانە.**

**گێ مەدەیە**

**ئەگەر زیاتر لە بەڕەی خۆت پێت ڕاکێشا، مەترسە ژیـان هـەر نەترسێ.**

**گێ مەدەیە**

**ئەگەر بۆ خۆشت عەتر نەبیت، ناوی عەترێك لە خۆت بنێ!**

**گێ مەدەیە**

**هەمیشە دەستەیەك حەبی دڵ ئێشە، لە گیرفانتدا هەڵگرە.**

گێ مەدەیە

**لە سیاسەتدا ئەگەر دۆبلاژ نەکرێی، هەر مۆنتاژ دەکرێیت.**

**گێ مەدەیە**

**ئێستا دووبارە دابەزین عەیب نییە.**

**گێ مەدەیە**

**ماوەیەکی دی (شکۆ) لە چین دروست دەکرێتەوە.**

**گێ مەدەیە**

**ئەوڕۆ كەس، ئەسڵو بەدەڵ لەیەك جیاناكاتەوە.**

**گێ مەدەیە**

**فەیسبووك كۆیلایەتی شینی بەرهەمهێناوە.**

**گێ مەدەیە**

**ژیان بە ڕەشو سپیش بگوزەرێنی، هەر ژیانە.**

**گێ مەدەیە**

**حاشا لە هیچ مەکە.**

**گێ مەدەیە**

**چونکە هەمیشە لە پاش شەڕێ، شاییە.**

**گێ مەدەیە**

**سەدی وەکو تۆ لە پەرلەمانە!**

گێ مەدەیە

گرنگ ئەوەیە ، نەبەزی.

**گێ مەدەیە**

**هەرچی کردت، لە تەنیشتی بنووسە (نێودەوڵەتی).**

گێ مەدەیە

ئەگەر خاڵیش بی، حیزب خاڵی زیاترت پێوە دەلکێنێ.

**گێ مەدەیە**

**ئەگەر بە جەماعەت نوێژتان چوو، بە جەماعەتیش سەرفترە بدەن.**

**گێ مەدەیە**

**ئەگەر دکتۆرات وەرگرت، ئەوکاتە ناسنامەی مرۆڤت دەدەنێ.**

**گێ مەدەیە**

**چەتەیی، سەد ناوی مۆدێرنتری بۆ داتاشراوە.**

**گێ مەدەیە**

**بە پێڵاوی تاکەو تاکیش، دەتوانی بە ڕێگادا بڕۆی.**

گێ مەدەیە

ئەگەر خۆشت نەبووی بە زێڕ، مۆبایلەکەت بکە بە زێڕ.

**گێ مەدەیە**

**خۆ ڕەفتارەکانت تابلۆ نین، بە سینگتەوە هەڵواسرابن.**

گێ مەدەیە

خۆ کەمووکوڕییەکانت، لەسەر گۆڕەکەت نانووسن.

**گێ مەدەیە**

**گرنگ بتکەنە سەرۆك، جا سەرۆكی هەر شتێك بێت.**

**گێ مەدەیە**

**لە قەرەباڵغترین شوێن، خۆتو گڵۆپەکانت بکوژێنەوە، خۆ هەر ون نابی.**

**گێ مەدەیە**

**گشتیو تایبەتی تێکەڵ بکە، شتێکت هەر دەست دەکەوێت.**

**گێ مەدەیە**

**هەر خەون ببینە، خۆ هەموو کەسیش ناتوانێ خەون ببینێ.**

گێ مەدەیە

خۆ لەو دنیایە، لەسەر هیچ تابلۆیەك نەنووسراوە

(خۆشەویستی قەدەغەیە).

**گێ مەدەیە**

**قەدەغەکردنی ڕاو، هەر لەسەر تابلۆیەکان نووسراوە.**

**گێ مەدەیە**

**هەر ژیان نا، خۆشەویستیش بۆتە دیجیتاڵ.**

**گێ مەدەیە**

**لەوانەیە هەموو ناماقووڵیەك، ببێتە یاسا.**

**گێ مەدەیە**

**بڵێ نەخێر، لە جێی هەموو ڕەزامەندییەکانت.**

**گێ مەدەیە**

**فەرمانەکان، بە تەنیا لەسەر کاغەز دەمینیێنەوە.**

**گێ مەدەیە**

**هەر فلکەی بەتەمای خودای نا، حکومەتی بەتەمای خـوداش هەیە.**

**گێ مەدەیە**

**دروشمی بەرژەوەندی گشتی، دەتپەڕێنێتەوە.**

**گێ مەدەیە**

**هیچ کلیلێك، بە کلیلێکی دی ناچێ.**

**گێ مەدەیە**

**ئەگەر دژە ژیانیش بەکاربیێنی، بەبێ ئەجەل نامری.**

**گێ مەدەیە**

**هەمیشە لە ژیاندا، چوار فلاش پێبکە.**

**گێ مەدەیە**

**ئەورۆ، ئەگەر لاسەنگ نەبی، هەر باوت نییە.**

**گێ مەدەیە**

**خۆت بکە بە کەسێکی گشتی.**

گێ مەدەیە

هەرچی دڵت خواستی، فوی بدە، چونکە مۆدەی قەبارەی گەورەیە.

**گێ مەدەیە**

**بە لاڕێگاکانیشدا، هەر دەگەیە شوێنی مەبەست.**

**گێ مەدەیە**

**لە ژیاندا، سیکۆتین لە هەموو درزەکانت بدە.**

**گێ مەدەیە**

**چونکە سەردەمی HDیە.**

گێ مەدەیە

جیاوازی لە نێوان ڕووناکی دەستکردو، ڕووناکی سروشتیدا نییە.

---

**گێ مەدەیە**

**هەمیشە بە (بەگ) بگەڕێوە.**

**گێ مەدەیە**

**بنووی‌و بە خەبەربی، هەر لە تەمەنت کورت دەبێتەوە.**

**گێ مەدەیە**

**خۆ هێشتا قەبر بە خۆڕاییە.**

**گێ مەدەیە**

**زبڵ بە زبڵ چاك دەبێ.**

**گێ مەدەیە**

**تا بمێنی، هەموو شتێك دەبینی.**

**گێ مەدەیە**

**درەنگیش بێت، هەر دەگەیە مەرگ.**

گێ مەدەیە

بازارِ پڕە لە کرێمی دژەپیری.

**گێ مەدەیە**

**هەمیشە چاویلکەی زەڕەبین، لەچاوکە.**

گێ مەدەیە

بە دڵی خۆت، بۆیاغی پرچ ڕەنگکردنەوە بکڕە.

**گێ مەدەیە**

**کێ مێژوو دەخوێنێتەوە.**

**گێ مەدەیە**

**چت پێخۆشە، لە تابلۆیەك بینووسەو هەڵیواسە.**

---

**گێ مەدەیە**

**خۆ نە تۆ بە دەوری زەویدا دەسـوورێیتەوە، نـە زەوی بـە دەوری تۆدا!**

**گیٚ مەدەیە**

**هەموو ئەو شتانەی تۆ پێتوایە کێشەن، ڕەنگە لە بنەڕەتدا هەر کێشە نەبن.**

**گێ مەدەیە**

**هەرچی بە دڵت نەبوو، فڕێی بدە ناو سەتڵی زبڵ.**

**گێ مەدەیە**

**هەموو شتێکی (سەفەر)ی بکڕە.**

**گێ مەدەیە**

**هەوڵبدە لە هەر شتێك، دانەیەكی یەدەگت هەبێ.**

**گێ مەدەیە**

**تاسە دروستکە، با سەردەمی خێراییش بێت.**

**گێ مەدەیە**

**لە کۆتایی ژیاندا، هەر دەچییە حەجێ!**

**گێ مەدەیە**

**لە تاقیکردنەوەکان یا تاقیت دەکەنەوە یا تاقیان دەکەیتەوە.**

**گێ مەدەیە**

**خۆ لە ناسنامەکەت نانووسرێ مرۆڤـــ !**

**گێ مەدەیە**

**خۆ نە بە بەنزین دەڕۆی، نە بە پاتری.**

گێ مەدەیە

گرنگ، ئەورۆ لە فەیسبووك بناسرێی.

**گێ مەدەیە**

**هەتا بژیت، دەبێت باج بدەی، باجی هەمەجۆر.**

**گێ مەدەیە**

**لە کۆتاییدا هەر دەبیە دایك یا باوك.**

**گێ مەدەیە**

**دزی، شەرت نییە بە یاسا پێناسە کرابێ!**

**گێ مەدەیە**

**(نا)ی پێش هەموو وشەیەك بسڕەوە.**

**گێ مەدەیە**

**دەکرێ هەموو شتێك ڕەنگ بکرێ.**

**گێ مەدەیە**

**بەرتیلدانو بەرتیل وەرگرتن، پێی دەڵێن (بزنس).**

**گێ مەدەیە**

**لە دڵی خۆت دا هەرچیت خواست، ئاڵای بۆ هەڵدە.**

## گێ مەدەیە

## هەموو پێچەوانەیەک قبووڵ بکە!

**گێ مەدەیە**

**هەرچی حەزت لێ نەبوو، بەراوەژۆی بکەوە.**

**گێ مەدەیە**

**لە هەموو جێگایەك، کلیلساز هەیە.**

**گێ مەدەیە**

**بڵێ پاکمان لە پاك.**

**گێ مەدەیە**

**خۆ کەس ناتوانێ ناو دڵت ببینێ.**

**گێ مەدەیە**

**خۆ ژیان، ئەقڵی پێویست نییە.**

**گێ مەدەیە**

**لاسایی ئەوانە بکەوە، کە ژیان دەژین.**

**گێ مەدەیە**

**چ نەبێ بەناو خۆتدا سەفەر بکە.**

**گێ مەدەیە**

**هەر نەبێ، لە برسان نامری.**

**گێ مەدەیە**

**ئەگەر ژیانیشت پێ نەکڕدرێ، بۆ ماوەیەك بە کرێی بگرە.**

**گێ مەدەیە**

**شەرت نییە هەموو جووتە کەوشێك، پڕ بە پێی خۆت بێت!**

**گیٚ مەدەیە**

**ئەگەر بە خەویش عاشق بیت، ئەوا گەورەترین دەستکەوتە!**

**گێ مەدەیە**

**نان ئەو نانە، ئەورۆ لەخوانە.**

**گێ مەدەیە**

**شەرت نییە، هەموومان شۆڕشگێڕ بین.**

**گێ مەدەیە**

**چونکە پێت هەیە، لەو دنیایە دەگەیتە هەموو جێگایەك.**

**گێ مەدەیە**

**ژیان ئەسڵیو کۆپی نییە.**

**گێ مەدەیە**

**چونکە هەر ڕۆژێك لەو ژیانەدا، تەمەنت هەڵدەلۆشێ.**

**گێ مەدەیە**

**بە بڕوانامەی دکتۆرا، چ بخوازی، بەدەستی دێنی!**

**گێ مەدەیە**

**هەر ماستاوان ساردبکەوە، ناوبانگ پەیدا دەکەی، پۆست وەردەگری.**

**گێ مەدەیە**

**بەبێ نەخشەش، لەو ژیانە هەر ون نابی.**

**گێ مەدەیە**

**هەرگیز شەرت نییە بە ڕێگای سەرەکیدا بڕۆی.**

**گێ مەدەیە**

**شوکری خودای بکە، هێشتا هەواش بە خۆڕاییە!**

**گێ مەدەیە**

**خۆت کاندید بکە، ئەوجا دەناسرێی.**

**گێ مەدەیە**

**دکتۆرای تۆزوبا، دەتکاتە کەسایەتی.**

**گێ مەدەیە**

**وا بڕوا لە (چین) دروستت دەکەنەوە.**

**گێ مەدەیە**

**هەمیشە وەك گوڵەبەڕۆژە، ڕووی خۆت بسووڕێنە.**

**گێ مەدەیە**

**هەموو شتێك بكە بە هاوبەش.**

**گێ مەدەیە**

**دووبارە بادانەوە عەیب نییە.**

**گێ مەدەیە**

**لە کۆتاییەکەی هەر پیر دەبی.**

**گێ مەدەیە**

**هەرگیز هەموو شتێك پێكەوە بەدەست ناهێنی.**

گێ مەدەیە

بۆ خۆت، دەرەوەی گۆڕەکەت نابینی.

گیّ مەدەیە

هیچ شتێك بە بایەخەوە وەرمەگرە، هەتا خۆتیش!

**گێ مەدەیە**

**هەرچی خەڵك كردی، تۆش بیكە.**

**گێ مەدەیە**

**فێربە زانیاری هەرگیز یەکسان نابێت بە زانین.**

**گێ مەدەیە**

**خۆت قوتاربکە، لە هەرچی قسە هەیە لەو ژیانەدا.**

**گێ مەدەیە**

**لەو ژیانەدا هەموو شتێك ئاسان دەبێ، ئەگەر بۆ خۆت گران نەبێ.**

**گێ مەدەیە**

**پاش هەر شتێك هەر كەسێك، شەوو ڕۆژ هەر لە سوڕان دایە.**

**گێ مەدێ**

**بەرامبەر ڕووداو دانیشە، تا ڕوودار دەبی.**

**گێ مەدەیە**

**وا دابنێ ئەسڵەن تا ئێستا، پارە نەهاتۆتە سەر دنیا.**

**گێ مەدەیە**

**قەت خۆت بە کەس بەراورد مەکە، چونکە بە ملیۆنانی باشترو خراپتر دەبینیەوە.**

**گێ مەدەیە**

**هەرچی خەونی هەتە تێیان هەڵدە، خەونی تر لە جێگای ئەوان ببینە.**

گێ مەدەیە

دان بە هەموو درۆکانت دابنێ، کە لەو ژیانەدا کردووتن.

**گێ مەدەیە**

**پاککەرەوە هەر بۆ ماڵێ نا، بۆ ناو دڵی خۆشت بەکرێ بگرە.**

**گێ مەدەیە**

**زاناو پسپۆری کوردی لە (چین) بە ڕادان دەدرێن.**

**گیٚ مەدەیە**

**خەڵك چ دەڵێنو، چۆن لەبارەی تۆ بیردەكەنەوە، ئەتۆ هەر ئەتۆی.**

---

گێ مەدەیە

دووسێ (پەمپی هەوا)ی یەدەگ بکڕەو، لە ماڵێ بیانپارێزە.

گێ مەدەیە

هەقیش وایە، هەست بکەی سبەی دەفڕی.

**گێ مەدەیە**

**لە باس بڕوانەو، باسی هیچ مەکە!**

گێ مەدەیە

خۆشارکێ، لەگەڵ مەرگ بکە!

**گێ مەدەیە**

**وەکو دایکتو وەکو بەڕێوەبەرەکەت، هیچ کتێبێك مەخوێنەوە،**

**خۆ ژیان هەر دەڕوا.**

**گێ مەدەیە**

**جار جار بە هەموو هێزی خۆت هاوارکە، منداڵانە بکڕوزێوە، ژیان پەکی بەو هەموو حەشاردانە نەکەوتووە.**

**گێ مەدەیە**

**خۆت هەڵخلیسکێنە لە کار، لە خۆشەویستی، لە پابەندبوون، ئەوجا خاڵە لاوازەکانت بژمێرەو پێبکەنە.**

**گێ مەدەیە**

**خۆ نازانی لەسەر کێڵی قەبرەکەت چ دەنووسرێ و کێ دەینووسێ.**

**گێ مەدەیە**

**بچۆ ئەو کتێبانە بکڕە، کە لە کتێبخانەی بەرپرسەکەت دەیانبینی، ئەتۆش کتێبخانەیان پێ بڕازێنەوە.**

**گێ مەدەیە**

**تەنافێك هەڵدە، هەرچی لێی نازانی پێیدا هەڵواسە.**

**گێ مەدەیە**

**ئەگەر لە دەرەوەش گەراج دەست نەکەوت، خـۆ لـەناو خۆتتـدا هەیە، لەوێ ڕاوەستە.**

**گێ مەدەیە**

**لەوانەیە هەزار کەسی وەك تۆ، لە شێخەڵلای هەبێ!**

## گێ مەدەیە

## ئەگەر حەرامزادەش بیت، سیاسەت بۆت سواخ دەدا!

گێ مەدەیە

**مەقەستێك هەڵگرە، هەرچی پێی وابەستەی، لەبنڕا بیبڕە.**

**گێ مەدەیە**

**ناوی خۆت (GOOGLE) بکە چ دەرچوو، تازە هەر ئەوەی.**

**گێ مەدەیە**

**هەرچی بیرۆکەیەك لە (تی ڤی) گوێت لێبوو،**

**بیکە بە هی خۆتو، هەر ئەو کاوێژ بکەوە.**

**گێ مەدەیە**

**خاڵی کۆتایی لەپشت هەموو شتێکی ژیان دابنێ، هەر ئێستا!**

**گێ مەدەیە**

**خۆ مەرج نییە لەو ژیانەدا، هەموو شتێکت لەبیر بمێنێ.**

گیٚ مەدەیە

ئەگەر دلٚ فەرمانی پیٚدای ڕاوەستە، ڕاوەستە، خۆ ژیان ڕاناوەستیٚ.

گێ مەدەیە

خۆت تەنها بە خۆشبەختی مەرجدار مەکە.

**گێ مەدەیە**

**پێیەکانت بۆ حەوا هەڵبڕە، خۆ مەرج نییە هەر بەپێوەبی.**

**گێ مەدەیە**

**خۆ بەکرێدان خەوش نییە، خەریکە نیشتمانیش وای لێ بەسەردێ.**

**گێ مەدەیە**

**گرنگ ئەندامی ئەنجومەنێك بی، جا ئەودەم دەزانی چەند گرنگی.**

**گێ مەدەیە**

**خۆ هیچ عەیب نییە، هەتا سیاسەتیش بەڕاوێژکاری بیانی هەڵدەسوڕێ.**

**گێ مەدەیە**

**هەر کەموکوڕییەك هەبوو، بیخە ئەستۆی شارەوانی.**

**گێ مەدەیە**

**گرنگ لە فەیسبووك، چەند هەزار لایکت هەیە.**

**گێ مەدەیە**

**دەستەواژەو وشەی هەر نووسەرێك، بکە بە هی خۆتو بینووسەوە.**

**گێ مەدەیە**

**تا دەمری خزمەتی هاوسەرو خزمەتی نیشتمان بکە، بەڵام خزمەتی خۆت بسپێرە بە شارەوانی.**

**گێ مەدەیە**

**گریمان ئەتۆ هەمیشە لەجێگای ڕاستی، لەکاتی ڕاستدا.**

**گێ مەدەیە**

**ئەگەر سۆنەش بێ، لەو ڕۆژگارەدا هەر تەڕ دەبێ.**

**گێ مەدەیە**

**خۆ هەموو ڕێگایەکانی ژیان، بە تۆ نابڕدرێن.**

**گێ مەدەیە**

**بەتەنها بۆ خۆت بە، دروست وەك خۆت ژیان قبووڵ بکە.**

**گێ مەدەیە**

**ئەگەر زمانیش نەزانی، زمانی جەستە ناهێڵێ پەکت بکەوێ.**

**گیٚ مەدەیە**

**هەموو دژە مانایەك، بە خوێن ساردی وەرگرە.**

**گێ مەدەیە**

**قەت لەدوای چووان مەچوو.**

گێ مەدەیە

**بەهانەیەکی یەدەگ، بۆ هەموو شتێك ئامادە بکە.**

گیٚ مەدەیە

خۆ خەڵکی، مۆری ماوەی بەسەرچوون لە پشتت نادەن.

**گێ مەدەیە**

**ئەگەر بتکەن بە جێگریش، دەکەویە ناو سەرەی پۆستەوە.**

**گێ مەدەیە**

**ژیان بەهەموو دیواندا تاقی بکەوە.**

گێ مەدەیە

**هەرگیز (دڵ) وەك (سەرچاوە)، حیساب مەکە.**

**گێ مەدەیە**

**هەر پێی دادەو تەواوە، بیرکردنەوەی ناوێ!**

**گێ مەدەیە**

**خۆ چوونە ناو خۆت، پێویستی بە ڤیزا نییە.**

**گێ مەدەیە**

**مەرج نییە بۆ هەموو کارێك، کەرەستەی تەواوت لەبەردەستدا هەبێت.**

**گێ مەدەیە**

**تێگوشینی بەتەمای دراوسێیان، هەر وشکە.**

**گێ مەدەیە**

**ژیان بەبێ (تامو بۆنی دروستکراو)یش، هەر ژیانە.**

**گێ مەدەیە**

**تا تینت تێدایە پێبکەنە.**

**گێ مەدەیە**

**ئەگەر دەترسی لەوەی نەبیتە کەسایەتییەکی پڕشنگدار، ئـەوا ڕستەیەك گڵۆپ، بەخۆتدا هەڵواسە!**

**گێ مەدەیە**

**هەموو ئەوانەی کەیفت دەشێوێنن، هێڵی چەوتیان بەسەردا بهێنە.**

**گێ مەدەیە**

**لە ژیاندا پڕەنسیپی ترافیك لایت، پەیڕەو بکە.**

**گێ مەدەیە**

**دەڵێن لەو ژیانەدا هەموومان لەژێر یەك ئاسمانین، بەڵام ناچینە ناو یەك قەبر.**

**گێ مەدەیە**

**هەرگیز ناتوانی دنیا لێبخوڕی، دنیا، تۆ لێدەخوڕێ.**

**گێ مەدەیە**

**چەند پاشبکەوی، مەترسی بۆ سەر کەس نییە، بەڵام ئەگەر پێشبکەوی دەبیتە مەترسی.**

**گێ مەدەیە**

**خۆ دروست نازانی، گۆڕەکەت لەکوێ دەبێت!**

**گێ مەدەیە**

**لەو ڕۆژانە شکۆی هەمووان، وەك داشی دامە یاری پێدەکرێ!**

**گێ مەدەیە**

**ژیان جار جارە، سەربەقولاتێت پێ لێدەدا.**

**گێ مەدەیە**

**بە تەنیا چێژەکانی ژیان، ئەژمار بکە.**

گێ مەدەیە

هێدی هێدی.. بۆ ڕادەکەی، خۆ ژیان ماراسۆن نییە، هەتا بیبەیەوە.

گێ مەدەیە

خۆت پێ هەر شتێکە، لەوانەیە ئەوە نەبی.

**گێ مەدەیە**

**وشەی خۆشمەدەوێی وەکو (لۆگۆ) بە هەموو جلەکانتەوە بنووسێنە.**

.............................................................................................

**گێ مەدەیە**

**گرنگ بڵێن هاوسەرگیری کردووە.**

**گێ مەدەیە**

**بە پێچەوانەی هەموو کردارەکانت، لەو ژیانە دەست پێ بکەوە.**

**گێ مەدەیە**

**گرنگ هەستییە سەرپێ، ئەوی دی هەموو پێکدێت.**

**گێ مەدەیە**

**بۆ خۆت پێناسەی تایبەت بەخۆت، بۆ هەموو شتێك بنووسە.**

**گێ مەدەیە**

**هەرچی بڕوانامەت هەیە، لەپشت خۆت هەڵیانواسە.**

**گیٚ مەدەیە**

**ئەگەر نەمری، حیزبێك هەر دەبینیەوە بتکاتە بەرپرس.**

**گێ مەدەیە**

**کێ دەزانێ، لەسەر سامانی گشتی، چەند منداڵت بنێرە زانکۆیەکانی دەرێ!**

**گیٚ مەدەیە**

**دوو خزمەتکار لە ماڵەکەتدا ڕاگرە، بۆ ئـەوەی هەسـت بکـەی گەورەی.**

**گێ مەدەیە**

**خۆت بکە بە تەختەی مارکەکان، هەموویان لەبەربکە.**

**گێ مەدەیە**

**هەموو شتێك بكە بە (vip)، بۆ ئەوەی هەست بكەی، كەسێكی گرنگو گەورەی.**

**گێ مەدەیە**

**حیزبێك هەر دەبێ، هەموو پسوولەكانت بۆ واژۆكا.**

**گێ مەدەیە**

**مووچە بۆ هەموو خانەوادەکەت وەرگرە.**

**گێ مەدەیە**

**هەر بە (first class) بگەڕێ، تا هەست بکەی (first)ی.**

**گێ مەدەیە**

**لەو هەڵبژاردنە، دەنگێکت بۆ دەکەنە هەزار دەنگو، هەر دەردەچی.**

**گێ مەدەیە**

**یەکێك پەیدا بکە لە خانەوادەکەت، شەهید بووبێت‌و وەك پــرد بیکە بە دروشم بۆ هەموو پەڕینەوەکان.**

**گێ مەدەیە**

**مڵکی گشتی بکە بە مەزرعە، وای دابنێ مرۆڤێکی زۆر گەورەی.**

**گێ مەدەیە**

**بابیشت، بە شەهیدی سەنگەر بنووسە.**

**گێ مەدەیە**

**خۆ بازاڕی چەکفرۆشتن داناخرێ.**

**گێ مەدەیە**

**یەك دەرزەن لەزگە، بكڕەو بیانپارێزە.**

**گێ مەدەیە**

**ئەگەر ببــی بە (شەریکەدز)، بەرەبەرە پۆست وەردەگری.**

**گێ مەدەیە**

**قەزای لە ماڵت کەوێ، تازە قەت مەڵێ، سواری کەرێ عەیبێکو، دابەزین دوو عەیب.**

**گێ مەدەیە**

**هەرچی دەبی با ببی، بچۆ ناو جێگایەکەتەوە، هەتا وەڕەس دەبی بنوو.**

**گێ مەدەیە**

**زەکات لە هەموو شتێکی زیادە دەدرێ، هەتا لە بێ عەقڵیش.**

**گێ مەدەیە**

**هەر چت لێ ئاشکرابوو، قاقایەکی لێدە.**

**گێ مەدەیە**

**هەرگیز مەیگەیەنە مریشکەڕەشەی.**

**گێ مەدەیە**

**جانتایەکی سەفەری بۆ ئامادە بکەو، کوێت بە ئەقڵـدا هـات،**

**هەڕۆ ئەوێ.**

**گێ مەدەیە**

**لەگەڵ عامێ، هەڕۆ شامێ.**

**گێ مەدەیە**

**چت پێ جوان بوو، خێرا بیکڕە.**

**گێ مەدەیە**

**لەکوێ پسا، لەوێ گرێی دەوە.**

**گێ مەدەیە**

**ئەوەی ئەورۆ پێیت تەواو نەکرا، سبەی تەواوی بکە.**

**گێ مەدەیە**

**کوێت پێخۆش بوو، لەوێ دابەزە.**

**گێ مەدەیە**

**لێخوڕە دەشتە.**

**گێ مەدەیە**

**قووقەی کەڵەشێریش نەبێت، هەر ڕۆژ دەبێتەوە.**

**گێ مەدەیە**

**(نۆ)ش برای (دە)یە.**

**گێ مەدەیە**

**خۆ دزی ماست نییە، بە لێوتەوە دیاربێ.**

**گێ مەدەیە**

**خۆ گەندەڵ بوون بە شەرت نییە.**